مانیفێستی دووەمی وێران

# سپیاتییەکانی ناو ڕەش
# ڕەشاییەکانی ناو سپی

شیعر

**فەرهاد پیربال**

هەولێر: ١٩٩٩

بڵاوکراوەکانی نووسینگەی گۆڤاری وێران ( ١٠ )

ـ بۆش، بە کوردی: پڕ. بۆش بە تورکی: بەتاڵ.
هەژار: هەمبانە بۆرینە، چ. سروش، تاران، ل ۲٦۳.

ـ کەمبە: لەسەر وەزنی ( زۆربە)، اقلیە Minority.

بەرگی دوواوە و مۆتیفەکان تەختیتی نووسەرن.

نەخشەسازی و جێبەجێکردنی بەرگ: هونەرمەند ( سەربەست عومەر).

تایپی کۆمپیوتەر و دەرهێنانی هونەری و بلاوکردنەوەی:

نووسینگەی وێران لە هەولێر. ت: ۲۸٦۳۰

تیراژ: ۷٥۰ دانە.

لەسەر ئەرکی نووسینگەی وێران چاپکراوە.

# قامووسی بۆشی نوێخوازی

## I

١- زۆر نووسەری دیکە هەن، وەک من، هەست دەکەن کە تایبەتن. بەڵام - بەداخەوە بۆ ئەوان- خاڵی لەیەکچووی نێوان ئەوان و من، تەنیا ئەم هەستکردنەیە و بەس.

٢- بەرهەمەکانی من، وەک ژوورێکی سەرجەم دیوارەکان ئاوێنەڕێژ، لەبەرئەوەی جوانیەکی سەرسوڕمێن وسامناکیان هەیە: خوێندەوار تووشی نامۆیی و هەترەشچوون و هەندێ جاریش پێکەنین دەکەن. هەر ئەمەشە وا لە خوێنەر دەکات نەتوانێت دەمودەست دان بە هونەرەکەمدا بنێت. زۆربەیشیان بە تەرجەمەکراوی، یان بە خوێندنەوە، جوانیی خۆیان لەدەست دەدەن. بۆیە هەر کەسێک بیەوێت جوانیی عەنتیکەیی و ناجۆری و ناشیرینیەکانی من بدۆزێتەوە، پێویستە ـ پێش هەموو شتێک ـ بێت بە (رابردوو) بلێت: شەوشاد.

٣- من هەر کاتێک شتێکی جوان و بێ هاوتا ببینم، خۆمم بیردەهێنێتەوە.

٤- لە داهێناندا گرنگ ئەمەیە: ئەو بەرهەمە چۆن و بە چ شێوازێک نووسراوە. لەمەش گرنگتر ئەمەیە: کێ دایهێناوە؟

## II

ئەو مەرج و خاسیەتانەی بەرهەمێکی نوێخواز لە بەرهەمێکی دیکە جودا دەکەنەوە، سەد و سی و سێ مەرجن، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ڕووانینێکی زۆر شەخسی و تاکڕەو لە بەرهەمەکەدا هەبێت. ڕووانینێکی وێرانکارانە، دژ بە زەوق و چێژی باو، دوژمنکارانە بۆ سەر دیاردە و ڕووانینە سەلەفیەکان.

٢- فۆڕمێکی سەیر، شێوازێکی سەمەرە، تەکنیکێکی سەرسوڕمێنی هەبێت.

٤- بەرهەمی نوێخواز پێویستە ناجۆر و ناوێزە بێت، هەڕەشە لە بەرژەوەندیی ئەدەبی و سومعەی هونەریی ئەو نووسەر و هونەرمەندانە بكات كە تەمەنیان لە (٤٠) ساڵ زیاترە.

# III

هەر هونەرمەند و نووسەر و ڕەخنەگر و ڕۆشنبیر و خوێندەوار و مێژوونووسێك ئەم مەرج و خاسیەتانەی سەرەوە ڕەفز بكاتەوە، مانای وایە: من لەم بەرزاییەوە دارێكم هەڵبڕیوە و «شتێك» دیار كەوتووە!

# IV

١- من بەڕاستگۆیی و ڕاشكاوی دەڵێم: قسەكردن لەبارەی خۆم، هەمیشە، گەورەترین كەیفخۆشیم بووە.
٢- بیركردنەوە لەبارەی خۆم، لەویش خۆشتر.
٣- ئەگەر زانیبێتم خەڵك كاتێكیان تەرخان كردووە بۆ بیركردنەوە و قسەكردن لەبارەی من، ئەمە وای لێكردووم هەست بە كەیفخۆشیەكی زیاتریش بكەم.
٤- من هەمووەدەم زیرەكیی خەڵكم بەوە هەڵسەنگاندووە: ئایا تا چ ڕادەیەك و چۆن منیان نرخاندووە؟
٥- هەر كەسێك متووی ئەم هەموو شتانەی من نەبووبێت و نەبێت كە لەم سەردەمە وێرانەیەدا كردوومن و دەیانكەم، بە ڕای من: گێلێكی تەواوە و هیچ ئاگای لە دنیا نیە.

# V

١- گرنگ ئەوە نیە بەرهەمی نوێخواز چەند كەس تێی دەگات و ژمارەی ئەو كەسانە چەندە كە پێشوازیی لێ دەكات: چونكە زۆربە (زۆربەی خەڵك)، هەمیشە پەیوەستی كۆنەكەیە و بە (باو) بەستراوەتەوە؛ تەنیا (كەمبە) دەتوانێ ببێتە هاوسەنگەری نوێخوازەكان. زۆربە و كەمبەش بە شەهادە و پلە و پایە نیە. جاری وا هەیە حەمامچیەك زۆر نوێخوازتر و چێژ ساغڵەمترە لە مامۆستایەكی زانكۆ كە دەرسی بابەتەكەش دەڵێتەوە.

٢- زۆربە چەند زۆرتر بن، هێندە زیاتر ڕقم لێیان دەبێتەوە. کەمبە چەند کەمتر ببنەوە، هێندە زیاتر خۆشم دەوێن. من- خۆیشم بچووکترین کەمبەم.

# VI

١- ئافرەت نزیکترین هاوسانی بیری جوانییە. لەبەر هەمان هۆیشە کە هونەرمەند و شاعیرەکان، زۆربەی جاران بە سەهوو دەچن: دێن ئافرەتێک دەخەنە جێگای ئەو جوانییە.
٢- کەواتە، هونەرمەند، پێویستە چەندین جار ـ بەلای کەمیەوە پازدە جار ـ لەگەڵ ئافرەت بەسەهوو بچێت و فریو بدرێت: بۆ ئەوەی لە ئاکامدا تێبگات کە (جوانی) لە دەرەوەی سنووری هەموو ماتەریالێکدایە.
٣- حیزب یان ((نیشتیمانپەروەریتی)) نزیکترین هاوسانی بیری جوانییە. لەبەر هەمان هۆیشە کە هونەرمەند و شاعیرەکان، زۆربەی جاران بە سەهوو دەچن: دێن حیزبێک یان ((نیشتیمانپەروەریتی)) دەخەنە جێگای ئەو جوانییە.
٤- کەواتە، هونەرمەند، پێویستە چەندین جار ـ بەلای کەمیەوە سێ جار ـ لەگەڵ حیزب و نیشتیمان بەسەهوو بچێت و فریو بدرێت: بۆ ئەوەی لە ئاکامدا تێبگات کە (جوانی) لە دەرەوەی سنووری هەموو ماتەریالێکدایە.
٥- ئەنجام:

ئەلیف: جوانی بە موڵک ناکرێت، بەڵکو تەنیا دادەهێنرێت. ئەمەیە ئەرکی هونەرمەند.

بێ: هونەر نابێ ببێت بە ئامراز و زوڕنای زەرد و سەوز و سوور. ئەگەر ئەمە کرا، پێویستە وێرانی بکەیت. ئەم وێرانەی تۆ هونەرە.

# VII

جەنگ و قەحپەیی و ئیعلام و تریاک و شتی قۆڕ، لە کۆمەڵی ئێمەدا، بە ملیۆن قات پارەی زیاتری لەچاو داهێنان لێ سەرف دەکرێت. من بۆ خۆیشم بیر لەوە دەکەمەوە، ئەگەر کاتی زیادم هەبووایە، چووبام لەم بوارانەدا کارم بکردایە: بۆ ئەوەی توانیبام وەک ئەو فیرعەونانەی بە پارەی بازرگانیکردن بە قەحپان هەرەمە جوان و بەرزەکانی میسرپیان بنیات نا؛

منیش چووبام جوانترین باڵەخانە و پەیکەر و مۆزەخانە و ئەرشیفخانە و مەدینەتولعابم لە شارە وێرانەکەی خۆمدا دروست بکردایە. چونکە لە ئەورووپاش جوانترین و بەرزترین سەرکەوتنەکانی مرۆڤ، لەوە دەچێ بە دزی و حیزی و شەڕ و بازرگانیی ناشەرعییەوە بنیات نرابن.

بەدرێژایی مێژوو، پیاوماقووڵە هەرە دیارەکانی هەر قۆناغێک، هەمان شتیان کردووە: فیرعەونەکان، پاشاکان، سوڵتانەکان، سەرەک کۆمارەکان، وەزیرەکان... بەڵام من، لەلایەک کاتی ئەوەم نیە، لەلایەکی دیکەشەوە: خۆم تەنیا بە لێپرسراوی وشە دەزانم؛ تەنیا بە وشە دەتوانم «شتێک» بکەم.

# VIII

کەواتە: من دەبێ بنووسم.

# IX

نووسین، بە بڕوای من: هەزار و دوو صەد و پەنجا و شەش هۆی جیاوازی هەیە. هۆی یەکەم: ئافراندنی جوانیەک کە هەڵقوولاوی شەخسی خۆت بێت. هەزار و دوو صەد و پەنجا و پێنج هۆیەکەی دیکەش، هەر هەموویان، پەیوەندییان بە هۆی یەکەمەوە هەیە، دەبێ بە نهێنی بمێننەوە ـ بەلای کەمەوە تاکو ساڵی (٢٠١٣).

# X

دە، ئێوەش، ئەی بەهرە پڕ تەشویشەکان!

ئەی گەنجێتییە لەیەکتر چووەکان!

ئەگەر دەتانەوێ ئێوەش، هەر یەکێکتان بینینێکی شەخسی و شێوازێکی تایبەت و دەنگێکی تاکڕەوی خۆتان هەبێت، بەڕاشکاوی پێتان دەڵێم: لاسایی من مەکەنەوە؛ بڕۆن بە عەقید و عەریف و نائیب عەریف و پاشاکانی شیعری ئەمڕۆی کوردی بڵێن: *ئێوە رووتن!*

بڕۆن ماڵێکی دیکە و دەزگیرانێکی دیکە بدۆزنەوە، یان ژنەکانتان تەڵاق بدەن!

بڕۆن هەرچی شتێکی حەزدەکەن بیکەن و بیڵێن و ببیسن و بۆنی

بکەن و دەستی لێبدەن، بیکەن و بیلێن و بیبیسن و بۆنی بکەن و دەستی لێ بدەن: تەنیا ئەو شتانە نەبێ کە ئێستا دەیکەن و دەیلێن و دەیبیسن و بۆنی دەکەن و دەستی لێدەدەن!

بۆ ئاگاداریی هەمووشتان: دووای خوێندنەوەی ئەم نامیلکە شیعرییە، یەکسەر، ئەم نامیلکە و مانیفێستە توورِ هەڵبدەنە نێو زبڵخانەوە. گەشکەیەک لە شیعرەکانم بگرن، منیش بە کۆنەخواز و کەودەن و پووت حسێب بکەن. بەکورتی: تۆپێکم پێوە بنێن و بەیاننامەیەکی تازەی جوانی خۆتان بنووسن !

قامووسی یەکەم

## بیرەوەرییەکانی دوورەوڵاتیم

١٩٨٤ : کاتێ ئازاری شکۆمەندم، دەمەوعەسران، لە شەقامەکانی (تاران)دا پیاسەی دەکرد، چڵکی سەدەکانی ناوەڕاستی لەسەر دەنیشت. ئێوارانیش: ماندوو، بە بەردەم «میدان ذوب اهن»دا، بەرەو ئۆردووگای «بیست و پێنج هەزار مەیتە ئاسوودەکە» لە کەرەج دەگەڕایەوە.

١٩٨٥ : قاچی ڕاستم لە دیمەشق برسێتی دەیخوارد، قاچی چەپیشم لە بەرلینی ڕۆژهەڵات: سەگی پۆلیسی.

١٩٨٦ : «پەنیرێکی بۆگەنی سارد» خەریک بوو سەرتاپای ڕۆحم ژەهراوی بکات. کیەرکۆگارد ڕزگاری کردم.

١٩٨٧ : سەرپشتی کەشتیەکەی ڕێگای ستۆکهۆڵم ـ کراکۆڤ تاقە حەشارگەیەکی ژیانم بوو.

١٩٨٨ : هەموو ئێوارەیەک لە قاوەخانەکانی (ڤیشی)و (بیزەنصۆن)و (گرۆنۆبڵ)و (مۆنتی کارلۆ) شەڕاب یان قاوەم لەگەڵ (پۆل ئێلوار)و (ژاک بغێل)و (ئاراگۆن)و (بلیز صاندرا) دەخواردەوە.

١٩٨٩ : جگەرگۆشەکانم، کاکۆڵ زێڕین، فەردە پەتاتەی ژەهراویان بەسەردا دەکەوت و کەڵەواژ دەبوونەوە. لەسەر سنووری بەهەشت – دۆزەخدا نۆ

هەزار و نۆصەد و نۆ گۆڕی بچکۆڵەم بۆ کۆرپەکانی خۆم هەڵکەند؛ ئێستا لەسەر گۆڕی هەر یەکێکیان حاجی لەقلەقێک سەوز بووە.

١٩٩٠ : لەگەڵ سەرۆکی دەوڵەتی فەڕەنسا (فرانسوامیتران) بەشەڕهاتم و ماڵیاهم بەردباران کرد.

ێێێێ : قەڵەمەکەم لە ئەرشیفخانەی نقخن، جەنتاکەم لە ماڵی مارگرێت دووراس، قاچم لە باخچەکانی ماڵی ژان ژاک رۆسۆ، چاویشم لە گەلەریەکانی شەقامی سێن کەوتبوون.

١٩٩٢ : عبدالقادر الجنابی بە ئەندرێ برۆتۆن و فیلیپ سووپۆی ناساندم، وتی: «ئێوە پێویستە ببنە برادەر».

١٩٩٣ : دەستی چەپم فرۆشت، بۆئەوەی بتوانم چاوێکی ئیتاڵی بکڕم. قاچی ڕاستم فرۆشت، بۆئەوەی بتوانم گوێچکەیەکی ئینگلیزی بکڕم. ڕەشاییەکانی پرچی خۆم فرۆشت، بۆئەوەی بتوانم کتێبێکی فەڕەنسی بکڕم.

١٩٩٤ : هەموو عارەقەی گیانی خۆم فرۆشت، بۆئەوەی بتوانم بلیتێکی گەڕانەوە بۆ هەولێر بکڕم.

٤ /

١٩٩٤

قامووسی دووەم

# کەسک وسۆری شینێک

ئابڕوو: چارۆگەیەکی تەنکە، جوانی جوانتر دەکا.
ئادەمیزاد: لەوەتەی هەیە دەمرێت و دەژیەتەوە، دەمرێت و دەژیەتەوە،

دەمرێت و دەژیەتەوە. زۆر سەیرە!
ئاژاوە: سەرچاوەی داهێنان.
ئافرەت: کتێبێکە لە هەژدە بەرگدا، هەر بەرگێکی هەزار و دوو صەد لاپەڕەیە؛ هەموویشی بۆشە.
ئاگر: حەفتاو هەشت واتای هەیە، گرنگترینیان: تاریکی.
ئاو: کۆیلەی سپیی خاک.
ئەسپێ: گوندێکە لە نزیک مەڵبەندی ئەترووش. هەروەها لە تەنیشت گاپیلۆن گوندێکی دیکەش بە هەمان ناو هەیە.
باج: کوڕی پووری ئیبراهیم خەلیل.
باڕ: بەختەوەریەکی کۆنی تاریک.
بازاڕ: ژنی عەبا بەسەر و عارەبانە و قەرەباڵغی.
باشوور: باشووری باکوور.
باوک: نەریتێکی قاوەییە.
بەڕێوەبەر: بەڕێوە، بەڕوو، بەرامبەر بەڕ، بەڕێوەبڕوا.
بێهوودەیی: بڕوانە وشەی تاکەکەس.
پاشا: پاش پاشتێلانەی پاشگەزبوونەوەی پاشا پاشەڵپیسە پاشەبەرەکانی پاشەڕۆژ، پاش نیوەڕۆیەک، پاشمیرە پاشقول لێگیراوەکان، پاشەو پاش، پاشماوە و پاشەڕۆکە پاشەکەوتکراوەکان بخەنە حاڵەتێکی پاشکەوتن و پاشاگەردانیەوە.
پانکە: جۆرە گۆرانیەکی فۆلکلۆری کوردییە.
پزیشک: گوندێکی کوردستان بوو، بەعس کاولی کرد.
پۆلیسخانە: نسبەتەن بە ئاودەسخانە، خۆشترە.
پەتاتە: پەتیارەکان لەناو پەت و پەتۆ و پەتادا، پێپەتی و پەتڕی پەتڕی، پەت پەتێن بە پەتا بکەن. هەروەها ئەم واتایانەشی هەیە: پەتای تا، پەتە تا، تۆ پەتاتە.
پەڕتووک: پەڕی تووک.
پەناهەندە: کوردێک زۆر باش لەوە گەیشتبێت کە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کورد پێویستە.
پیاوکوژ: بڕوانە پەیڕەو و پڕۆگرامی حزبەکانی کوردستان، لاپەڕە ١٣ ـ ٢٢.
تاریکی: زەندەقی لە ئاگر دەچێ.
تاکەکەس: گەر دەوڵەتی نەبێ، وەک مەیموونی قەشمەڕی بەسەر دێت،

بەتایبەتیش ئەگەر كورد بێت و بشچێتە ئەوڕووپا.
تڕ: جۆرە ڕەنگێكە دیاری ناكرێت.
جادوو: حەمامچییەكی خەڵكی چەمچەماڵە، ژن و منداڵی نیە، بە شەوان دەفڕێ.
جەژن: جۆرە چێشتێكی كوردەوارییە، بەیانیان دەخورێ.
چوارچێوە: هی هەرچی بێ، هی هەر كێ بێ... بیشكێنە و لێی وەرە دەرێ!
چوارخشتەكی: خەڵكی سەدەی نۆزدەهەمە و ئەمڕۆ هەست بە غەریبی دەكا.
تەنیا مەلایەكان ڕووی دەدەنێ.
حاجی لەقلەق: ئاسوودەییەكی سپیە.
حەڕام: جمكانەی هونەر و جوانییە.
حەمام: چایخانەی ژنان.
خۆكوشتن: مانای وایە كە تۆ ڕازیت كە ژیان - وەك خۆی - تەنیا گەواد و قەشمەڕ و جەللادەكان بەڕێوەی ببەن؛ ژیانیش هەر لەناو چڵپاوی سەدە كۆنەكاندا بمێنێتەوە. ڕازی بوونێكی بێ ئەخلاقانە و گێلانەیە!
دادپەروەری: گوندێكی كوردستان بوو، شەڕی نێوان یەكیەتی و پارتی وێرانی كرد.
دەوڵەت: ئەگەر هەتبێ و بچیە وڵاتێكی غەریبی، هێز و كەسایەتی و متمانەیەكت پێ دەبەخشێ.
ڕاپەڕین: لاپەڕین.
ڕاوەڕووت: وشەیەكی تازەیە، لەم سێ چوار ساڵەی دووایيدا هاتۆتە ناو زمانی كوردییەوە.
ڕشانەوە: ئەگەر بەسەر حكوومەت و زەوقسزەكاندا بێت، بەعەیب ناگیرێ.
ڕووانگە: بڕوانە گۆڤاری وێران، ژمارە (٢)، هەولێر: ١٩٩٤، یەكەم لاپەڕە.
ڕەپ: جۆرە بۆنێكە، ژن حەزیان لێیە.
ریخەڵۆك: زۆر دوورو درێژە، باس ناكرێ.
زاوا: هەڵلا هەڵلا هەڵلا!
زێد: و كم من منزل یالفه الفتی
و حنینه ابدا لاول منزل
ژن: هەموو ئەو شتە قۆڕ و عەنتیكە و جوانانەی كە پیاو نینی و حەزدەكا هەیانبێ.

ژوور: ئامرازی پەیوەندییە.
سەفەر: هەموو شوێنێکی دیوە.
سەربەخۆیی: لەناو نووسەر و ڕۆشنبیر و هونەرمەندانی ئەمڕۆدا نەماوە.
شەڕ: بەردێک بوو وەبەر شووشەی پێودانگەکانی ئەدەب و هونەری ئەمڕۆ کەوت.
شەمەندەفەر: هێشتا نەگەیشتۆتە کوردستان.
شیعر: بێدارییەکی دڕندەیە.
عەنتەر: ناوە، مێیە، بەرکاری ناڕاستەوخۆیە.
قاز: هێمنییەکی بێ حەیایە.
کارەسات: کارگە و کاربرا و کارئاسک و کارنامە و کارژۆڵە و کارامە و کاربەدەست و کارت و کارخانە و کارگوزار و کاروانچیەکان، هەموویان پێکرا لە کاروانسەرایەکی کاروانکوژەی پڕ لە کاروبار و کاریز و کارەبادا کار لە یەکتر بکەن!
کفتە: خەریکە وردە وردە قڕی تێدەکەوێ.
کۆچڕەو: نسبەتەن بە قەتڵوعام باشتر بوو.
کورتان: دەوەستێتە سەر مەسەلەیەک: لەسەر پشتی کێیە؟
کوردستان: بازاڕی فرۆشتنی کەرەستە ئێکسپایەرەکانی تورکیا و ئێران.
گازینۆ: نسبەتەن بە مزگەوتەکان ژمارەیان کەمترە.
گوناه: بڕوانە وشەی حەرام.
گەنجێتی: مێژووی ئەشکەنجە و تلانەوە بەدەست جوانییەوە.
لاشە: گوللەی بەرکەوتووە و ماشە.
مار: سوپاسی دەکەم کە تاکو ئێستا پێی وەنەداوم.
منداڵی: ئەو شتانەی کە گەورەبوون و خیانەت و سەر هەڵگرتن لەدووای خۆیەوە جێیان دەهێڵێ.
نابینا: ئەحمەد ناڵبەند، کە یەکەم شاعیری کوردە خۆی کوشتبێت.
نوێخوازی: شەڕی براکوژیی نێوان یەکێتی و پارتی ناهێڵێ جێبەجێ بکرێت.
واق وڕماو: جیلی ئەمڕۆی ئێمە.
وەزیر: بچێتە سەر تووی هەر تووی دەخوا
بچێتە سەر گووی هەر تووی دەخوا
هێلکە: عادەتێکی سپیی خڕە.
یاپراخ: ی.. ی.. ی...

یەک شەممە: ىئصزمز ضن فقه زلآكعزخفخهضقف زىزنم هضغز
سقم زىزنم هصضفش

قامووسی سێیەم

## دۆسیەی ژمارە ٢٧٣٦/ج
## لە تەجنیدە سووتاوەکەی هەولێر

٥ / ٦ / ١٩٨٠ أول تعين

١٤ / ٨ / ١٩٨٣ التحق لاداء الخدمة العسكرية لأول مرة

٤ / ٩ / ١٩٨٣ انتدب الى وضيفة التدريس

٣١ / ٣ / ١٩٨٥ اعيد الى الخدمة العسكرية في الحلة

٢٤ / ٥ / ١٩٨٥ هرب من الخدمة العسكرية

١٧ / ٩ / ١٩٨٥ عاد نادما و التحق بالجيش

٢١ / ١٢ / ١٩٨٥ انتدب الى التدريس

٦ / ١٢ / ١٩٨٦ اعيد الى الخدمة في البصرة

١ / ١ / ١٩٨٧ هرب من الخدمة

١ / ٦ / ١٩٨٧ اعيد الى الخدمة في الديوانية

٢٣ / ٤ / ١٩٩٠ نقل الى أمرية منطقة المواصلات الغربية

٣٠ / ٥ / ١٩٩٠ تسرح من الجيش

٢١ / ٧ / ١٩٩٠ اعيد الى الخدمة العسكرية من جديد

١١ / ١٠ / ١٩٩٠ هرب من الخدمة

٢٦ / ١٢ / ١٩٩٠ عاد نادما و التحق بالجيش في سرپول زهاو
١٨ / ٢ / ١٩٩١ انتحر خلال اجازة اسبوعية في احدى بيوت الدعارة في ضواحي «بغداد».

قامووسی چوارەم

# ئەو هەشت حەرفەی لە هەموو حەرفێکم خۆشتر دەوێن

## ک

حەرفی (ک) شتی کۆنم بیردەخاتەوە: (کاردۆخییەکان)، بە خۆیان و ئاگرە کڵپەسەندووە کۆنەکانیان، لەسەر لووتکەی کێوە سەرکەشەکاندا، یان لەژێر کەپرۆکە کزە بێ کاریتەکاندا، لەکەنار کادین و کەڤر و دارکاژەکاندا. (کاوەی ئاسنگەر)م بیردخاتەوە، بە خۆی و بە کۆمەڵێک کلیل و کەوان و چەکوش و کارمامزەوە. (کچی کافرۆش)، بە خۆی و کڵنجە و کەمەربەندی کەژاوە ئاسای خۆیەوە، کاتێ کازیوان بەپێش کاروانسەرا و کەبابخانەکاندا وەکو کەو تێپەڕ دەبوو. (کۆزینە)، کۆتەڵ)، (کۆمار)، (کەوان)، (کلک)، سەدان شتی کۆنی دیکە.

من هەست دەکەم پەیوەندییەکی زۆر دێرین و پتەوی ڕۆحیم بەم حەرفەوە هەیە. پەیوەندیی من بەم حەرفەوە، وەک پەیوەندی پشتاوپشتی پەنیر وایە بەگیا، وەک پەیوەندیی پشتاوپشتی شەپقە بە گامێش.

گەلێک جاران کە دەچمە کتێبخانەیەک یان ئەرشیفخانەیەک، لێم بۆتە خوو: یەکسەر دەچم دەست دەدەمە ئینسیکلۆپیدیایەک؛ بەدووای لاپەڕەکانی حەرفی (ک)دا دەگەڕێم، تەنانەت لە ئەندێکسی کتێبەکانیشدا. کە دەیدۆزمەوە، ئیتر ئۆقرە دەگرم. ماوەیەک بێدەنگ لێی ورد دەبمەوە، پاشان ئەویش، وەک کەوێکی کز چاوەکانی هەڵدێنێ و بۆم پێدەکەنێ؛ پێم دەڵێ: «وەرە، دانیشە»، «با کزەی کزانەوەی کوڤانی کۆنی کاکێشانت بۆ بگێڕمەوە».

# و

حەرفی (و)، ورد ورد، لەناو تەم تومانێکدا، بە پەنادیوارێکی وەردیدا وەردەسوورێتەوە. دەبینم: لەناو وەرزێکی وەیشوومەییی وندا، چەند وشیە واژەیەکی وەنەوشەیی واق ورماوی پێیە؛ گونیەیەکی گەورە و وروژاوین وەک گونیەی واخوێنە هەژارەکانی، بە کۆڵ خۆی داداوە و دەڕوا: دۆکیوومێنتی مێدەکانی پێیە، دەیەوێ بیانگەیەنێتە سەدەی زاینی. دوو مێژوونووسی موسڵمان، یەکێکیان عارەب و ئەوی تر فارس، ڕێگای پێ دەگرن؛ داوای هەویەی لێ دەکەن. ئەویش بەرتیلێکیان دەداتێ و تێدەپەڕێ.

حەرفی (و) سەرەڕای ئەم وردی و بچووکییەی خۆی، هەتا بڵێی چاونەترس و جەسوورە. جگە لەوەش شارەزاییەکی فراوانی لەبارەی زانستی کیمیا و فیزیادا هەیە، هەموو کتێبەکانی (سەهرەوەردی) و (ئیبن سینا)ی خوێندۆتەوە. جار بەجار شیعریش دەنووسێ، بەڵام بە زمانی فارسی.

# ر

حەرفی (ر) دڵناسک و زراڤ و باریکەڵەیە: کزەبایەکی بەئاستەم لێی بدا دەلەرێتەوە. هەمیشە غەمبارە، هەست بەتەنیایی خۆی دەکا. هەرگیز ناتوانێ لەناو خەڵکدا دابنیشێت و شەرم نەکا. بەرزایی باڵا و درێژیی مل و ناسکایی لەش و لاری، جوانیەکی سحراوی و سەرنجڕاکێشیان پێی بەخشیوە. ئەمە وای کردووە کە بتوانێ زۆر بەئاسانی سەرنجی خەڵک بۆ خۆی ڕابکێشێ. هەندێ لە برادەرە بەدخووەکانی، بانگاشەی بۆ دەکەن؛ دەڵێن گوایە «هۆمۆسێکسوێلە».

حەرفی (ر) زۆر کەم لە ماڵ دێتە دەرەوە. گەلێک جاران بیر لە خۆکوشتن دەکاتەوە. کتێبێکی لەبارەی جوانیی خۆی نووسیوە بەڵام تاکو ئێستا بڵاوی نەکردۆتەوە.

# د

حەرفی (د) هەتا بڵێی بەفیز و دڵبڵندە، هەمیشە جلوبەرگی ڕازاوە و

بەنەخش و نیگار لەبەردەکا. جارانیش، لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا، هەمیشە کڵاوێکی قووچەکی لەسەر دەنا، بە سواری ئەسپێکەوە، ڕمبێکی درێژی بەدەستەوە دەگرت، بە کورتەک و شەلواری مرادخانییەوە دەچووە ڕاو: بە ئانقەست بەپێش کۆشک و تەلاری داریووش پاشای هەخامەنشییەکاندا تێپەڕ دەبوو، بۆ ئەوەی بزانن کە «گەنجی کورد» چەندێک قۆز و جەسوور و دڵبڵندن. هەتا بڵێی لەدەست عارەب و تورک و فارسەکان داخ لە دڵە، تاکو ئێستا دەیان جار لەگەڵ حەرفی (ط) و (ظ) و (ق) بەشەڕ هاتووە. هەر لە سۆنگەی ئەم ڕقە ئەستوورەشی، لە ساڵانی سییەکانی ئەم سەدەیەدا بوو بە کاژێک. داینا وە بیرەوەرییەکانی خۆی بنووسێتەوە.

حەرفی (د) لەو کاتەی کە (ئیبن بەتووتە) و (مارکۆ پۆڵۆ) بە کوردستاندا تێپەڕبوونە، ئەو لە (ئاربێل) بووە: هەر دوو جاران، لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجی دیکەی ڕۆشنبیری کوردستان، لەژێر قەڵای (ئەربەئیللۆ)دا، لە بەردەم دەرگای ئەحمەدیەی ئەمرۆ. چوونەتە پێشوازیی ئیبن بەتووتە و مارکۆ پۆڵۆ.

حەرفی (د) ئێستا لەسەر سنووری ئێران و عیراقدا قاچاغچێتی دەکا، تاکو ئێستا چوار جاران ژنی هێناوە، هەر چواری تەڵاق داون. سێ کوڕی هەیە، یەکێکیان ئێستا لە ستۆکهۆڵم دەژی.

# س

حەرفی (س) بە ڕەسەن شیعەیە. لە ڕۆژگاری کۆندا نەبووە: سەلجووقیەکان لە سەدەی یازدەهەمی زایندا دروستیان کرد. پێشتر ئەگەر هەشبووبێ ئەوا لە شێوەی (ث) یا (ز)دا هەبووە.

حەرفی س سمێڵێکی سووسنیی جوانی هەیە، دەم و چاو باریکەڵە، کڵاوێکی هەورامیانەی مەیلەوسەوز لەسەر دەنێ، دایک و باوکی خۆی نەدیوە، بەهەتیوی لەناو کۆشک و تەلاری غەزنەوی و سەلجووقیەکاندا گەورە بووە. پاشان حەزی لە کچەڕەوەندێکی هەورامی کردووە، ئیدی کۆشکی پاشایەتیی غەزنەویەکانی جێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە دەشت و دەر، شێت و شەیدای کچە ڕەوەندە هەورامیێکە!

حەرفی (س) حەز لە ڕەنگی سپی و سەوز و سوور دەکا، حەز لە شتی سارد و سوێر، تەنانەت چێشتیشی هەر بە سوێری و ساردی پێ خۆشە.

یەکجار زۆر ساردەمەنی دەخواتەوە. خۆیشی نازانێ بۆچی؟ دەڵێ «تەبیعەتە».

حەرفی (س) دەنگێکی یەکجار خۆشی هەیە. بەیت و باڵۆرە و قەتار و حەیران و پایزە و هۆرە ئەم دایهێناون. وا نۆ سەد ساڵ زیاترە شێت و شەیدای ئەو کچە ڕەوەندەیە، بەناو ئەو شاخ و داخانەی کوردستاندا دەسووڕێتەوە، شێت و سەرگەردان، گۆرانیی جوانی و خۆشەویستی بۆ دڵبەرەکەی دەڵێتەوە.. کەسیش نایبینێ! خەڵک هەر ئەوەندە دەزانن کە ئێستا ئامۆزایەکی هەیە، لە دایەرەی ئەوقافی سلێمانی فەرمانبەرە.

# ت

حەرفی (ت) کە قسە دەکات دەمی دەگیرێ. بە تانە و تەشەری خەڵک، یەکتاو دەکەوێتە تالووکە، کلاوێکی کەتانینی تاریک دەکاتە سەر. تاو تاو، زۆر توند، دەکەوێتە کۆکین و تینی لێ دەبرێ، بەژن و باڵای هەر لە تیترواسک دەچێ، زۆر حەز لە تەماتە و تەماشاکردنی تەراتێنی ئەسپ دەکا. هەمیشە تێلەگەیەکی لەسەر شانە و کەس نازانێ بەرەو کوێ دەڕوا؟

جاران ترياک و حەشیشەی دەکێشا، بەڵام ئێستا تەرکی کردووە؛ ماوەیەکیش لە ماڵەوە کۆتری بەخێو دەکرد: کۆترەکانی دەبرد لە (دیاربەکر) بەڕەڵای دەکردن، دووای سێ ڕۆژ هەموو کۆترەکان، پێش خۆی، دەهاتنەوە هەولێر بۆ ماڵەکەی خۆیان.

ترياک کێشە تاپازە تەمبەڵەکانی بەرتەکیەکان خۆشیان ناوێ، دەڵێن «ترکەن و ترۆڵە». بەڵام تاتەشۆر و ترکانەبێژ و تاپۆچی و جۆتیار و تەنەکەچییەکانی ناوشار هەتا بڵێی خۆشیان دەوێ. جارێکیان لەگەڵ (ی) بەشەڕ هاتبوو، لەسەر ئەوەی (ی) بۆ گاڵتەپێکردن پێی گوتبوو: «تۆنی!».

حەرفی (ت). بەقەد (منارە چۆلی)ی هەولێر، سادە و ساویلکەیە.

# أ

حەرفی (أ) لە گوندێکی نزیک شاری ئەستەمبۆڵ لەدایک بووە، لە (هەیمەنە)، بەڵام دایک و باوکی بە ڕەسەن خەڵکی ناوچەکانی شێخ بزەینیی کوردستانی عیراقن. کاتی خۆی سوڵتانی عوسمانی - لەگەڵ

سەدان خێزانە كوردی دیكە- ڕایگواستبوونەوە ئەو گوندە دوورەدەستەی كوردستان. خوشكێكی هەیە بە ناوی (ئن) برایەكیشی بە ناوی (ئۆ)، برایەكی بچووكتریش بە ناوی (ئە). هەر چواریان لەبەر ئەوەی لە خێزانێكی دینی پەروەردە كراون، هەرگیز لە باوكیان (ئـ) جیانابنەوە: تەنێ (أ) نەبێ، كە بەم دوواییە توانی هەیمەنەی گوندەكەی خۆیان جێ بهێڵێت و بچێتە ئەوروپا؛ لە ئەڵمانیا لە زانكۆ بخوێنێت.

(أ) هێشتا منداڵ بوو، لە گوندەكەیاندا، ئاهەنگی ئاوی ئازاراویی ئاواتەكانی ئاسمانی بەسەر ئاژەڵی ناو كانییە ئاخڵەییەكانی ئاوەزدا بڵاودەكردەوە. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای ئەم سەدەیەدا پەیوەندییەكی بەتینی لەگەڵ گەنجە كوردە ئاوارە ڕۆشنبیرەكانی ناو شاری ئەستەمبۆڵدا هەبووە، ئەندامی (كۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی) و (كۆمەڵی نەشری مەعاریفی كوردی) بووە. پاشان لەسەرەتای ساڵانی سییەكاندا دەگەڕێتەوە كوردستانی عیراق و لەوێ چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار بە زمانی كوردی دەردەكا؛ (ئاواز). (ئازادی)، (ئاگر)، (ئاژاوە)...

حەرفی (أ) دووای كۆچی دوواییی كردنی (شاكر فەتاح) دنیای لەپێش چاوكەوت. لە كتێبی یاداشتنامەكەی خۆیدا (كە هێشتا چاپ و بڵاونەكراوەتەوە)، لەلاپەڕە (٢٧٦)دا نووسیویەتی كە «پەیوەندییەكی هۆمۆسێكسوێلانەی لەگەڵ شاكر فەتاح دا هەبووە».

## ن

حەرفی (ن) ژنێكی هەتا بڵێی نیان و ناسك و نازەنینە، بەڵام تا ئێستا شووی نەكردووە. زۆر حەز لە ڕەنگی نارنجی دەكا: دەسماڵی نارنجی، كراسی نارنجی، كەوای نارنجی، سوخمەی نارنجی...

كاتی خۆی پەیوەندییەكی گیانی بەگیانی و جەستەییانەی لەگەڵ حەرفی (د) هەبوو، دووای ئەویش لەگەڵ ئەفسەرێكی ئینگلیز، كە بۆ داگیركردنی عیراق هاتبوونە سلێمانی، كەوتە خۆشەویستیەكی قووڵەوە. زۆر شت لەو ئەفسەرە ئینگلیزە فێر بوو.

حەرفی (ن) یەكەمین ژنی كوردە، دووای ماهشەرەفخانمی ئەردەڵانی، كە نووسین و بەرهەمی خۆی، بە ئیمزای خۆی و بێ ترس بڵاوكردبێتەوە. ئێستا لەسەر كتێبێكی «زاراوە ناسی» كاردەكات. چەندین وشە و زاراوە كە ئەمڕۆ نووسەرە كوردەكان بەكاری دەهێنن، بۆ نموونە وەكو: (نەوبین)،

(نەوبەهار)، (نەوشێواز)، (نەودەم)، (نەورەوت)، (نەوبیر)، (نەوهەنگاو)، (نەوژەن)... هەموویان ئەو داییهێناون و بڵاوی کردوونەتەوە. ئەمەش ڕاستییێکە، کەس نایزانێ.

حەرفی (ن) حەز لە شتی نوێ دەکا: بیروڕای نوێ، شێوە ژیانی نوێ، هونەری نوێ، نووسینی نوێ... هەموو شتێکی نوێ. بەڵام هەمیشە هەناسەی حەیف بۆ ئەوە هەڵدەکێشێ کە تاکو ئێستا بۆی ڕێک نەکەوتووە بچێتە «ئەورووپا».

قامووسی پێنجەم

## پۆرترێتی خێزانێکی فەرامۆشکراوی ڕاکردووی ژێر بارانە مووسەکانی جەنگێک کە تاریکایی ئاودەسخانەی تڕی براکوژی و ناعەقڵانیەت نەیهێشت تەواو بکرێت.

**دایک:** گلکۆیەکی درێژی زەردە، بێکەس و تەنیا، لەسەر شۆستەیەک فڕێ دراوە.

**باوک:** کورسییەکی لاق زۆر درێژە، لە گۆڕستانێکی نیوەڕۆییانەی چۆڵدا.

**برای گەورە:** دار عەلەتریکێکی لارەوەبوو، تێلەکانی داپچڕاون و شۆڕبوونەتەوە ناو سیانە فرمێسکاوییەکانی گەڕەک.

**برای ناوەنجی:** چوار تایەی پەنچەر لەسەر ڕێگای هەولێر - مووسڵ.

**برای بچووک:** وێنەیەکی لە چوارچێوە گیراو بەسەر دیواری ژوورێکی ماڵەوە کە بۆ رۆژانی پێش شەڕی عیراق و ئێران دەگریت.

**خوشکی گەورە:** دەستێکی شەقار بردوو، کە هەر پێنج پەنجەکانی، وەک پەیکەرێکی برۆنز، لە مەیدانێکی گشتیی ناو شاردا، غەریب غەریب، بەرەو ئاسمان قووت بوونەتەوە.

**خوشکی ناوەنجی:** چەند بوخچە و باوڵێکی ڕەنگاوڕەنگ لە پەنا دیواری گەراجێکدا کراونەتەوە. کەس نازانێ هی کێن؟

**خوشکی بچووک:** ئوتوویەکی کۆن، لە ماڵە دراوسێیەک خواستراوەتەوە.

خوشکی هەرە بچووک: مێزێکی چکۆلانەی شکاو، لەناو باخچەیەک کەوتووە.

قامووسی شەشەم

# ٤٤ پێناسە بۆ دوورەوڵاتی

١- گەردەلوولێک بتبا.
٢- گاستینێکی قەرەباڵغ، منداڵێکی نۆ ساڵانەی لێ بێتە ژووریّ کە لە زمانی هیچ کەسێک و هیچ شتێکی ئەویّ تێ نەگات.
٣- دۆزەخ.
٤- غزهخغقمکصقنز
٥- خۆ لە خۆ گۆڕان، خۆ لێ گۆڕان.
٦- دڵی لە جمان نەکەوتووی داهێنان
٧- زەبوونی و چاوشۆڕی و هەست بەکەمی کردن.
٨- زەبوونیەکی زەبوون، چاوشۆڕییەکی چاوشۆڕ، هەست بەکەمی کردنێکی کەم.
٩- غەریبی کردنی دراوسێکەتان.
١٠- بە تاقی تەنیا، بە دڵێکی پڕ لە هەستی غەریبی و تەنیاییەوە، بێ پارە و پوول، لە کامپۆ سانتا مارگریتا حەز بکەی بگری.
١١- حەزبکەی سەرتاپای خزم و کەسوکار ی کوردستانت بۆ بگوازنەوە بۆ نزیک ماڵەکەت لە گەڕەکی ئۆکسفۆرد، لە لەندەن.
١٢- لە ئێرانەوە، هەر بە پێ، ڕابکەیت، تا دەگەیتە چین.
١٣- سێزدە چەقۆ لە ژنێکی دانمارکی بدەیت: لەبەرئەوەی لێت جودا دەبێتەوە و پشت لە ( گریّ چینییەکەت) دەکات.
١٤- تەنیایی، تەنیایی، تەنیایی...
١٥- نیوەشەوێک، باوەشکردن بە درەختێکی تەنیای سەرشەقامێک.
١٦ ـ پیری
١٧ـ جورئەتی ئەوەت نەبیّ تەماشای ناو چاوی هەرزەکارێکی تورەهاتی ئەڵمانی بکەیت!
١٨- قەمسەڵەی دەستی دووەمی دزراوی دەست پەناهەندە لبنانیەکان، بە نرخێکی نیوە قیمەت بکڕیتەوە.
١٩- لە کۆپنهاگن، بە کەتـرە ژنێکی پیری ناشیرینی لە مێرد دابڕاوی

پۆڵەندی بڵێی: « پێخۆشحاڵم بە ناسینت» .
٢٠- لە ستۆکهۆڵم سواری شەمەندەفەر بیت، بەدووای کچە قەرەجێکی سەماکەری سێرک بچیتە هەنگاریا (گەڵەسیۆز)، لەوێ ناونیشانەکەی نەدۆزیتەوە و .. بگریت.
٢١- نیوەشەوان، لە گەرمەی خەو ڕابچڵەکیت و بۆ دایکت بگریت!
٢٢- نەخۆشیی بەردەوام بەردەوام بەردەوامی چاوەڕێکردنی نامە.
٢٢- حەزکردنی بەردەوام بەردەوام بەردەوامی نووسینی نامە.
٢٣- سنووری ئەڵمانیا بەرەو هۆڵەندا، یان هی پۆڵۆنیا بەرەو سوێد، بە پێ ببڕیت و وابزانی کە ئیتر سەقام دەگریت و ئاسوودەیی ڕووت تێدەکا.
٢٤- دڵ لە دڵ دانی ئێوارانی یەکشەمووان:
ئایا بچی بەتەنیا لە بارێک دانیشیت، یان نا ؟
٢٥- ئێرەیی ببەی بە سەگێکی نەرویجی.
٢٦- خۆت فڕێ بدەیتە ژێر شەمەندەفەرێکی ناو توولەبانەی ستۆکهۆڵم و هیچیشت لێ نەیەت.
٢٧- «بەرازی ڕەش»
٢٨- لە ناوەڕاستی مەیدانی ڤێستەپۆڕت، لە کۆپنهاگن، سەعات دووانزە و نیوی شەو بەسەرخۆشی، بە کوردی هاوار بکەیت:«ئای چەندم خۆش دەوێ» .
٢٩- حەز بکەی تەنانەت باوەش بە «ئایدز »یشدا بکەیت: تەنیا بۆ ئەوەی هەست بە «سۆزێک» بکەیت و تەنیاییت بڕەوێتەوە.
٣٠- خۆزگەی ئەوەت بێ نەورۆز زوو دابێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ کوردەکان کۆببیتەوە.
٣١- چاوەڕێکردنی بەردەوامی بەردەوامی ئێوارانی یەکشەمووان.
٣٢- لە ئەستەمبۆڵ، بە روتبە و نیشانە و ئەعزایەتیی مەجلیسی عالی‌یەوە لە (ئوطظە) کە مەڵبەندی پرەنسەکانی کۆنی ڕۆم بوو، لە قەسرێکی مومتازدا دائەنیشتم. کە شەو ئەنوستم، لە خەوما: لە گورگەدەر، لە باخەکەی شێخ ئەحمەدی زلێخا هەنارم ئەدزی.
«پیرەمێرد: ژین، ژ ٨٩٤، ت١٩٤٧/٢»
٣٣- «ئایرش باڕ» ، لە ستۆکهۆڵم، لە بەرلین، لە کۆپنهاگن، لە لەندەن.
٣٤- منداڵێک بیت و هەست بکەی لەناو حەشاماتێکی گەورەدا لەدایکت دابڕاویت.
٣٥- پیرەژنێکی بە ڕەسەن جوولەکەی پورتوگاڵی، لە پاریس، بەزەیی بە

حالّتدا بێتەوە و پێت بلّێ:« تۆ بۆچی ناگەڕێیتەوە ولاّتی خۆت» ؟.
٣٦- سێزدە سالاّن مەنفا و دەربەدەریەکەی عەرەبی شەمۆ لە سیبیریا.
٣٧- لە فڕۆکەخانەی دیمەشق بتەوێ تەیارەیەک بتەقێنیتەوە.
٣٨- هەژدە مانگ بە کوردی قسە نەکەیت و لە داخی دەردی بێ ولاّتیی لە ئەورووپا، وەک شـــەریف پاشـــا، داخی دلّی خـــۆت بە کچ و ژنە ئەورووپاییەکان هەلّبڕێژیت.
٣٩- لە لەندەن، لە قاتی یازدەهەمی ئاپارتمانێکەوە خۆت توورِ هەلّبدەیتە خوارەوە.
٤٠ ـ غەریبی کردنی عەفیفە ئەسکەندەر و رەسوول گەردی و جاربەجاریش (حمدیه صالح و بناتها).
٤١ ـ وابزانیت مەنفا و غەریبییەکەی حاجی قادری کۆیی لەچاو ئەوەی تۆ گەمەی مندالاّن بووە.
٤٢ ـ باوەش بە دارێکدا بکەیت: وابزانیت دەزگیرانتە.
٤٣ـ حەشیشەکێشان و خۆتەسلیم کردنە تەنویمی وموگناتیسی: بەس بۆئەوەی تەنیا جارێک « ژوورەکەی خۆت » ببینیتەوە.
٤٤ـ دووای حەشیشەکێشان و مەستبوونێکی بەنگ، سوێند بە چل و چوار پێغەمبەران بخۆیت کە بەڕاستی، بوویتەتە پێغەمبەر !

قامووسی حەفتەم

# شینێکی سەوز

لە ژنێف، بەرێککەوت، ژان ژاک ڕۆسۆم بینی؛ وتی:
- هانێ «دان پیانانەکانم»، بیبە؛
لای خۆتان بیکە بە باخچە.

لە پاریس، بەرێککەوت، ڤۆلّتێرم بینی؛ وتی:
- هانێ ئەوەتا وڕێنەکانم، بیانبە؛
لای خۆتان بیانکە بە قانوون.

لە ستۆکهۆلّم، بەرێککەوت، ستریندبێرگم بینی؛ وتی:
- هانێ ئەوەتا ڕقبوونەوەم لە ژن، بیبە؛

لای خۆتان بیکە بە مۆنالیزا.

لە رۆکێن، بەرێککەوت، نیتشەم بینی، وتی:
- هانێ ئەوەتا شێتیم، بیبە؛
لای خۆتان بیکە بە سەوزەگیا.

لە قورتوبە، بەرێککەوت، هەمەنگوام بینی؛ وتی:
- هانێ ئەوەتا خۆکوشتنم، بیبە؛
لای خۆتان بیکە بە ژیان.

## سپیاتییەکانی ناو رەش،
## ڕەشاییەکانی ناو سپی

## سەرگەڤاز

دەتبینم، ئەی شیعر، لە دوورەوە:
دووكەڵێكی مۆر لە پەنجەرەی چاوەكانتەوە هەڵدەستێ
شانەكانت
تك
تك
پەشیمانیی ئێوارانی لێ دادەچۆڕێ
ئاوازەكانت:
هەڵ
وە
ر
ی

و
قافیەکانیشت وەک کۆت و زنجیر لەدوواتەوە
یەک یەک تێکشکاو.
دەتبینم، لە دوورەوە:
لە جەنگ
لە دوورەوڵاتی
لە پایتەختی هەرەسەکان
لە نـــیـــوەڕۆ کـوژراوەکـانــەوە

دەگـەڕێــیــتەوە.

لەم شەڕە سەختەی مانەوەدا
یەکجار ماندوویت
بەڵام سەربڵند!

دەتبینم، لە دوورەوە:
دووکەڵێکی مۆر
لە پەنجەرەی
چاوەکانتەوە
هەڵدەستێ.

١٩٩١

## تەرتەپـێـل

خەونێکی خۆش، دوور و درێژ

وەک (منداڵی) کە هەرگیز لێت جودا نابێتەوە،
وەک (جوانی) کە هەرگیز ئەندێشەت جێ ناهێڵێ.

هەرچی شتێکی هەتبوو و هەتە و دەتبێ
لەپێناو ئەو خەونەدا دەیدۆڕێنیت.
لە کۆتاییشدا پێشبینیەکانت دەبنە خ
ه
ر
ما
نه
یه
ک
بە دەوری وەهمێکی مانگینەوە؛
کراس و دەرپێ و فانیلەکەت لەسەر
سیسەمێکی غەمگین
خۆشت بەڕووتی لەسەر گۆڕێکی تاریک
ڕادەوەستیت و هەڵدەلەرزی:
وەک (منداڵی) کە هەرگیز لێت جودا
نابێتەوە،
وەک (جوانی) کە هەرگیز ئەندێشەت جێ
ناهێڵێ.

١٩٩٢/٢

# ٣

کافکا دەڵێ: هەموو شتێک ڕەشە.

جێمس جۆیس دەڵێ: هەموو شتێک خۆڵەمێشییە.
مۆدیلیانی دەڵێ: هەموو شتێک ملێکی درێژ و باریکە.
ستریندبێرگ دەڵێ: هەموو شتێک شەڕێکی بەردەوامە لەنێوان ژن و پیاودا.
دارەین دەڵێ: هەموو شتێک سەرکەوتنی بەهێزترەکانە.
لۆرانس دەڵێ: هەموو شتێک سێکسە.
نیووتن دەڵێ: هەموو شتێک نسبیە.
مارکس دەڵێ: هەموو شتێک پارەیە.
گۆرکی دەڵێ: هەموو شتێک خەباتی چینی کرێکارە.
برۆتۆن دەڵێ: هەموو شتێک خەونە.
ئەراگۆن دەڵێ: هەموو شتێک ئێلزایە.
هیدایەت دەڵێ: هەموو شتێک فەنتازیایە.
مۆنی دەڵێ: هەموو شتێک پەمبەیە.
منیش دەڵێم: هەموو شتێک دەردی نەتوانینی باوەشکردنە بە جوانیـدا.

## تەخمیس لەسەر شیعرێکی ئینگلیزییەوە

شعع قس□غنهمززهنئاخ
شعع قس□غیضفرقینئؤف
All of my شـعع قس□غغقهصزمنشعع قس□غکضذهومزن
chairs
شـعع قس□غدمقهصزمنشعع قس□غنضنهزمنشعع قس□غ
سضفشزمن
ئازیزم
All of my beards
شـععز قس□غذخمنشعع قس□غشقرزننزنشعع قس□غعزننقفنشعع

قسـ□ـغدخعخعزنئؤف
شـ عع قسـ□ـغکـخکـزمنشعع قسـ□ـغذونضفنشعع قسـ□ـغیخهزمنشعع
قسـ□ـغسمزضفرنشعع قسـ□ـغنقفشن
ARE DEAD

١٩٩٣

م ادام پارەی پێ□ڵاوێک لە پاریس
سێ کەسێ برسێێ لە سیبیریا پێ□ی ت□ێر دەک □رێ،
مادام سـ □لێ ک□ڕۆنێ ساردێ سـ □وێدێ
دەکاتە ژیانێ سێ و سـ □لێ ڕۆژێ سێ و سـ □لێ کەسێ برسێێ
سۆمال□ێ،
مادام نرخێ بیپسێ کۆلایەک لە شیکاگۆ
دەکاتە مووچەێ یەک مانگێ تەواوێ مووچەخۆری□کێ ب □لێ مووچە لە
هەول□ێر،
مادام پاوەن □دێک دەکاتە دوو تەنەکە بەنزین لە سارایەڤۆ،
مادام نرخێ عەگال□ێک لە سعوودیە
دەکاتە دوو خانوو بۆ ب□ێخانوویەکێ خانەدان لە ئەرمینیا،
مادام مارک□ێکێ ئەڵ□مانێ دەکاتە نزیکەێ قوتووە پەن □یرێک و
یەک فەردە پەتاتە لە پیترسبۆرگ،
مادام نرخ □ێ دەرپ□ێ قوتەیەک لە ژن□ێڤ
دەکاتە پازدە کورتەک و شەڵ□وار لە بۆمبای،
م ادام دۆلار□ێکێ حیز دەکات □ە پ□ێنج سەد دینار لە سـ □لێمانێ،
مادام تەنانەت سـ □لێ پ□ێنج سەد دیناریش ناکاتە تەنانەت
گ□لاس□ێک دۆندرمە لە ڤینیس.
دەب □لێ ئەم جیهانە، سەرتاسەرێ، وی□ران ب □کرێ!

١٩٩٣/٩/٥

# سروودێک
# بۆ یەکیەتیی نیشتیمانی کوردستان و
# پارتی دیموکراتی کوردستان و
# رۆژنامەکانی رێگای ئازادی و ئاڵای ئازادی

لەسەر پردی ڕیالْتۆ ڕاوەستابووم
گوێم ڕاگرتبوو:
لەولای قەراغی زێی زاتەرە
چەند کەشتییەک
سنووقی فیشەگ و چەک و گوللەیان باردەکرد؛
لە قەراغ دورگەی بوورانۆشەوە
چەند کەشتییەکی زەبەللاحی تر
سنووقی گەورەی شووشەی ڕەنگاوڕەنگ.

تەنیا
تێر
پڕ بەدڵ
حەزم دەکرد بەگەڵ یەکێک لەو کەشتیانە بکەوم و
هەرگیز نەگەڕێمەوە هیچ شوێنێک.

١٩٩٣/٦

**سەرەتای بەدبەختیەکانی ژیانم**

**٥٥٠ پ.ز.**
تەمەنم هێشتا دوو ساڵانە،
بە نێزە و سەرەسمی ئەسپ،
بەسەر پشتم دەکەون: منداڵیم ونجرِ ونجرِ دەکەن.
**٤٠٠ پ.ز.**
تنۆکە شەونم و پەڵکەگیای سەر پێستم دەسووتێنن،
**٣٣١ پ.ز.**
جیهانگیری ڕۆژئاوا و پاشای ڕۆژهەڵات لەسەر پشتم
شەترەنج دەکەن؛
ماڵەکەم پڕ دەبێ لە کەللە سەر.
**٥٠٠**
ئەباعوبێدەی جەڕڕاح ئاگرکردنەوە لە ماڵەخزمەکانم قەدەغەدەکا.
**١٥١٤**
پاشای فارس و سوڵتانی تورک بە شمشێر دەمکەنە دوو پارچە:
هەر پارچەیەکم دەخەنە سنووقێکەوە
و
کلیلم دەدەن.
**١٦٠٠**
لە بەتلیس، گیای ژەهراوی دەرخواردی ئەسپی بوڕاقی باپیرە
گەورەم دەدەن.
**١٩٠٨**
لە ئەستەمبۆل فیلێک گۆیچکەی چەپم دەخوا.
**١٩١٤**
نەوت لەناو شادەمارەکانم دەدۆزنەوە؛
ناوسکم هەڵدەدڕن و زیواڵ زیواڵم دەکەن.
**١٩١٩**
تووڕەیی و بێزاریم نەخشەیەکی جوگرافیی ئاوسە،
شەو تا بەیانی دەزریکێنێ.
**١٩٢٣**

خوێنم: مەرەکەب، پێستم: کاغەز، سەرم: مۆر؛
پەیماننامە و پیلانێک لەسەر لەناوبردنم مۆردەکەن.

**١٩٢٥**

ڕووبارێکی خوێن ڕێگای ماڵە کاولکراوەکەی خۆمم پێ نیشان دەداتەوە.

**١٩٢٦**

بەفر بەسەر ڕۆژنامەکاندا دەبارێ و
پێڵاوەکانم ڕیشیان لێ دەڕوێ،
وەک شێت
بەناو بازاڕ
و
شەقامەکاندا
دەسووڕێمەوە.

## سەوزترین زەرد

لە نزیک کامپۆ سان لووکا
لە باڕی ئەڵڤاڵتۆ
بە ڕێککەوت تووشی مارکۆ پۆڵۆ هاتم.
پەرداخێک شەڕابی سوورمان پێکڕا خواردەوە
باسی سەفەرە درێژەکەی خۆی و هەولێری بۆ کردم؛
سەیری پێدەهات کە هەولێر تا ئێستا ماوە !

٩٣/٦

# سروودی غەریبەیەکی سەرشینی دەست و پێ سپی

لە تەورێز
دانەیەک گەنم هەڵگرتەوە
گوتم: «بۆ چۆلەکەیەکی برسی دەیبەمەوە هەولێر».

لە ڕێگای نێوان یەزێلۆ و ڤینیز
درەوشانەوەی چەپکێ گلۆپی عەلەتریکم دیت
گوتم: «دەسکەنەی دەکەم
دەیبەمەوە بۆ کۆڵانە تاریکەکانی سلێمانی».

لە شتووتگارت
جریوە جریوی ڕەنگینی پۆپەی چنارانم دیت
گوتم: «دەیانچنم
دەیانبەمەوە بۆ شەقامە غەمگینەکانی زاخۆ».

١٩٩٢/١١

# رەشترین شین

هۆ ... دیاربەکر!
هاتمە لات بتبینم،
کەچی لەژێر بەفرێکی ئەستووری کانوونیدا حەشار درابوویت.
قاچەکانت لەناو چڵپاوی سەرشۆستەکاندا، قاپووتێکت بە خۆ
دادابوو، ڕوندک ـ ئاخ ـ دلۆپ دلۆپ دادەڕژایە سەر شانەکانت.
شووره ڕەشە بڵندەکەشت، وەک باپیرەیەکی حەوت هەزار ساڵە،
بازنەییانە، باوەشی بە ڕۆحی کەسیرەتدا گرتبوو.

هاتمەلات،
ویستم مێژووی شکۆمەندی سەردەمی پاشا و میرە بەخشندەکانی
چاخەکانی ناوەڕاستت بخوێنمەوە؛ ویستم بە ڕێگای ئەو کاروانە
مەچەک خشڵاوی و گەردەن پڕ مرواریییانەت ئاشنا ببم کە چەندین
سەدەیە تۆ بە «ڕێگای ئاوریشم» دەبەستێتەوە، کە تۆی کردبوو بە
شمشێرێک لەنێوان سەلجووقییەکان و ئاق قۆینلوو.
هاتمەلات،
ویستم بەو کاروانسەرایانەت ئاشنا ببم کە جاران « هوتێلی»
گەڕیدە ڕووس و جاسووسە ئیتاڵی و بازرگانە پورتوگاڵی و
جوگرافیاناسە ئەڵمانەکان بوون و تاکو ئێستاش لەوانەیە
پەڕەمووچێکیان، نەخشەیەکیان، دەمانچەیەکیان یان کتێبێکی

کۆنیان لەلات لەبیرکردبێت و لە دەلاقەیەکت هێشتا هەر مابن؛ ئەو کاروانسەرایانەی کە جاران پڕی «زێڕ» بوون، پڕی کچە ئەرمەن و نەستۆری، کە هەر لە گابەستنەوانان، نیوە ڕووت، خۆیان دەنێو شەڕابی گۆرانی و سێوی سەما هەڵدەکێشا.

هاتمەلات،
ویستم گۆرانیە قوون خڕە، سەماکەرە، وەک ڕانەکەرویشک برژاو، سماقرێژەکانت بۆن بکەم . ئەم حەزەی من، دەتگوت حەزی سەرخۆشانەی ڤیکینگەکانە بۆ باوەشکردنێکی موستەحیل بە کەڵەگەتییەکی حەرامدا.
ویستم هەموو ئەو کەیف وسەفا شەهوەتبزوێنانەی ڕابردووت و ڕووتیی سەرتاپای سپیدارەکانت، سەرلەنوێ، لەناو (باخچەی چا) و قاوەخانەکانتدا ببینمەوە و چیتر «دۆمینە» نەبێتە تاقە خولیا و تاقە مەئوای زەوقی پیاوانەم.

هاتمەلات،
ویستم وەک میرێکی سەدەی شازدەهەم، تەبای جاران، لەنێوان پەڕەمووچی میرزا و کتێبی چەلەبیەکدا، ئانشکم لەسەر سەری شێرێک، دابنیشم.. تێر تێر تامی بخوور و بۆنی رەنگی رایەخ و ڕانەگۆشتی سوورەوەکراو سەرمەستم بکەن: *سوڵتان تەنانەت بە سەگیش ڕانەگرم!*

هاتمەلات،
ویستم خەونی جوانەمەرگی ئیسحاق سکووتی و عەلمانیەتی عەبدوڵڵا جەودەت و نائومێدییە پەمبەییەکانی قەدری جەمیل پاشا، کە لەناو پەڵکە گیاکانی قەبرستانەکەتدا سەوز بوونەتەوە، بۆن بکەم.

هاتمەلات،

ویستم ببینم: لەجیاتی كاریتە ـ ئەی بەستەزمان ـ عەلەتریكی
ئاسن لەملا و لەولای ئۆتۆبان و ڕێگەكانت چێنرابن؛
لەجیاتی كەریش، شەمەندەفەر-یان هیچ نەبێ ئۆتۆمۆبێل- بەناو
ڕێگا پێچاوپێچە شاخاوییەكانتدا گوزەر بكات
بەرەو داهاتوو.

هۆ دیاربەكر!
هاتمەلات، بتبینم؛
كەچی لەژێر بەفرێكی ئەستووری كانوونیدا حەشار درابوویت.
خەنجەرێكی ژەهراوی، بە قەد منارەی مزگەوتە گەورەكەت،
چەقێنرابووە بڕبڕەی پشتت؛ لەناو زستانێكی سپیدا، سەرتاسەر،
شەلاڵی خوێن بوویت.
چی
ب
ك
ە
م
!

## مۆرێكی باریكی زەردهەڵگەڕاو

ئاسمانی پاریس باراناوییە، یەكجار شپرزە.

ئەستێرەكان لەبەر زەنا زەنای مرۆڤ
تا دێ زیاتر هەڵدەئاوسێن
باڵندەكان سەرزەمینیان بۆ ناخوێندرێتەوە؛
ئەوەتا ڕۆژانە:

لە مۆنماخت،
لەسەر گردە قەرەباڵغە کەسک و سۆرەکەدا، زیاتر لە دوو صەد و
سی و سێ نیگارکێشی یۆنانی و کۆری و عەرەب و عەجەم و کورد
و چینی و سنگافووری و هیندی و ئەرمەنی
لە پێشبرکێیەکی عارەقاویدان لەپێناو ١٥٠ فرەنکی زیاتر.

لە باربێس،
لە بەردەم بازاڕی هۆسەی ی‌ئخ‌هض ،
ژنە مەغریبی و جەزائیریەکان، هەر یەکەی منداڵێک بە کۆڵیانەوە،
ڕادەکەن ؛ دەرپێ و فانیلە دزراوەکانی دەست پەناهەندە سریلانکی
و لبنانیەکان بە نرخێکی هەرزانتر بۆ مێردەکانیان بکڕنەوە.
لە شانزێ لیزێ،
لە گازینۆیەکی مەمک ڕووتی نزیک ماڵەکەی جان بێل مۆندۆ،
عەگال بەسەرێکی سعوودی و مەسیحییەکی خەڵکی سووریا،
عەقدێکی شەراکەتی ناردنە دەرەوەی بیپسی کۆلا مۆردەکەن
بەرەو ئەسینا.

لە پلاس دیتالی،
لە قاوەخانەیەکی نزیک بارەگای حیزبی دیموکراتی کوردستانی
ئێران، تیرۆریستی دەوڵەتێک خۆی دانووساندووە
بۆ تیرۆرکردنی سەرۆک حیزبێکی ئۆپۆزیسیۆن.

لە کاختییێ لاتان،
لە چێشتخانە موسڵمانەکاندا،
بەرازی لە شیشەدراوی سەر ئاگر دەخولێتەوە و
حەشاماتێکی فغیت خۆریش
تێپەڕدەبن و
برسی برسی تەماشای دەکەن.

لە شاتلێ،
لە بەردەم هۆڵی مۆسیقای پاشایەتی،
كەمانچەژەنێك كەمانەكەی ڕاخستووە:
بەڵكو ئەو فیستان و قەرەوێتە پایەدارانەی
دەچن گوێ بیستی *چوار وەرزەكەی* ڤیڤاڵدی بن؛
خێرێكی پێ بكەن.
لە شەقامی لافایەت،
لە چێشتخانەیەكی چینییەكاندا،
هەر چوار سەفیری عێراق- ئێران- توركیا- سووریا،
لە دەوری مێزێك:
لەپێناو كوشتنی پەپوولەیەك
پستەپست و گفتوگۆیانە.

لە شەقامی تغۆدێ كادیغۆ،
ژاك بغێلی ئەویندار
لەناو پۆلێك كچی جواندا دەگریت و گۆرانی دەڵێ: نەمو كیت پا!

لە شەقامی توورنەفۆرتیش،
لە ئاپارتمانی ژمارە ١٤١،
لە ژووری ژمارە ١٤،
پیرە گەنجێكی كورد،
لە بەرپەنجەرەی ژوورەكەیدا
دانیشتووە:
ڕۆژنامەیەك
دەخوێنێتەوە و...
دەگری.

*ئاسمانی پاریس باراناوییە، یەكجار شپرزە.*

## پۆرترێتی هاوڕێم، سەرگۆن پۆلس

لە پاریس، لە گەڕەکی سانت دونیس، لە شوققەکەی خۆمدا
لەناو ڕەسمە کۆنەکانی سێزدە ساڵ پێش ئێستەمدا،
بوتلێک براندی دەدۆزمەوە. بینی پێوە دەنێم
تا سەرخۆش دەبم:
دەزگیرانێکی ١٧ سال پێش ئێستەی خۆمم بیردێتەوە،
چەند هاوڕێیەک کە لە جەنگی عیراق- ئێراندا کوژران،
نیوەشەوە سەرخۆشە هاوینییەکانی ساڵانی حەفتا،
ئەو کۆڵانە تریفەییەی کە تێیدا خواحافیزیم لە دایکم کرد،
ئەو بەندیخانەیەی کاتێ جێمهێشت و
زیندانییەکان شەڕیان لەسەر بەتانیە جێماوەکەم کرد،
هەروەها چەند شوققەیەکی کۆنی پەرپووتی
تاران و دیمەشق و ئەنقەرە و
چەند سۆزانییەک کە تا بەیانی لەناو نوێنەکەمدا کۆخیان
بوو.

بوتڵە براندییەکە لە پەنجەرەی شووقەکەمەوە تووڕ هەڵدەدەمە
خوارەوە
وابزانم بە سەری پەناهەندەیەکی ئەفریقی دەکەوێ؛
هاوارێکی لێ هەڵدەستێت و
چەند جنێوێکی مزرم پێدەدا.

# Apprivoise - moi !

ئێوارەیەک
لە ڤینیز
لە ژوورێکدا
تەنیا
بێکەس
لەسەر قەرەوێلەیەک
بێداربوومەوە
گوێم ڕاگرت
لەودیو پەنجەرەوە
دوو پیرەژن
قسەیان لەبارەی منەوە دەکرد:
– ئین کۆیلە کازە چێ ئوون سێنیۆرێ، ما نۆن لۆسسۆ کیسێ.
– ئێ ئوون سترِانیێرۆ کێ چێرکە، لە سووە ئێنفانتسیا.

١٩٩٣/٦

I

لە
پاریس
جارجار
دەچم
لەسەر
بڵندترین
دوندی
بورجەکەی
ئیڤێل
رادەوەستم؛
هەموو شوێنێکم لێوە دیارە:
تەنیا هەولێر نەبێ !

شینێکی
رەشاو
لێ
دا
چۆ
ڕا
و

من حەزناکەم چیتر خنکانی ڕووناکیەکان و تەرمی نیشتمانە سەربڕاوەکەم و خوێناوی برسێتی ببینم؛ من دەمەویٚ خۆم توورڕ هەڵدەمە ناو زەریای نەمانەوە: بەڵام داخ، وشە!

**وشە**، توند توند، وەک گوریسێک

چۆن شێت لە شێتخانەدا توند دەبەسترێتەوە، ئاوها بە ژیان بەستوومیەتیەوە.

١٩٩٣

# شیعرێکی زۆر درێژ بۆ دایکم

غەریبیت دەکەم...

## ژیانم لە چەند دێڕێکدا

تۆپێک،
چەند کچێک،
چەند ڕێگایەک
چەند وشەیەک...

گۆڕ نی ڤێرگول و گۆڕینی
ش وێتی وشەکان
ل پێتاو تەقاندنەوەی تریقانەوەی
توانا ت ێگەیشتووە تینووەکانی تەنیایی..

هەم ووڕێیەک دەچێتەوە سەر بانە.
هەم ووڕێیەک باز ە، دەچێتەوە سەر.

هەم وو ڕێیەک سەرباز ە، دەچێتەوە.
هەموو سەرباز ە، دەچێت ەوە ڕێیەک.
هەموو س ەر دەچێتەوە باز ەڕێیەک.
هەموو بانە، س ەر دەچێت ەوە ڕێیەک.
هەم وو دەچێتەوە سەر باز ەڕێیەک.
ڕێیەک دەچێتەوە سەر هەموو بانە.
ڕێیەک، هەم وو، دەچێتەوە سەر بانە.
ڕێیەک دەچێتەوە. هەموو سەربانە.
ڕێیەک باز ە، دەچێتەوە سەر هەموو.
ڕێیەک باز ە، دەچێتەوە هەموو سەر.
دەچێتەوە سەر هەم وو ڕێیەک، بانە.
دەچێتەوە، سەربانە: هەم وو ڕێیەک.
دەچێتەوە سەر هەموو باز ەڕێیەک.
دەچێتەوە سەر بانە، هەم وو ڕێیەک.
دەچێتەوە هەموو س ەڕێیەک، بانە.
دەچێتەوە هەم وو ڕێیەک، سەربانە.
دەچێت ەوە ڕێیەک: سەر هەموو بانە.
دەچێتەوە بانە، هەموو س ەڕێیەک.
دەچێتەوە بانە، سەر هەم وو ڕێیەک.
دەچێتەوە باز ە: ڕێیەک، سەر ؛ هەموو..

سەر، هەم وو، دەچێتەوە باز ەڕێیەک.
سەر هەموو باز ە. دەچێت ەوە ڕێیەک.
سەر، هەم وو، دەچێت ەوە ڕێیەک. بانە!
س ەر دەچێتەوە هەموو باز ەڕێیەک.
س ەر دەچێتەوە هەم وو ڕێیەک. بانە!
سەرباز ە! دەچێتەوە هەم وو ڕێیەک.
سەر باز ە. دەچێتەوە هەم وو ڕێیەک.
سەربانە! هەم وو دەچێت ەوە ڕێیەک.
بانە، هەم وو دەچێتەوە س ەر ڕێیەک.
باز ەڕێیەک دەچێتەوە سەر هەموو.
بانە! س ەر دەچێتەوە هەم وو ڕێیەک.

بانە! هەموو ڕێیەک دەچێتەوە سەر.
بانە! ڕێیەک دەچێتەوە سەر هەموو.
بانە! هەموو دەچێتەوە سەر ڕێیەک.
بانە دەچێتەوە سەر هەموو ڕێیەک.

# بۆبەڵات

لەلای ئێمە: ژیان ژەنگی ژەهری ژانی ژیاری تێدا دەهەژێ
لەلای ئێمە: زریان زیپکەی زاری زەماوەندی زیقنی زەمانی تێدا دەزێ
لەلای ئێمە: رووبار ریشی رازی ڕێوی لەری ڕێیانی تیا دەڵەوەڕێ
لەلای ئێمە: چاو چەڵتووکی چیۆرمەی چەقی چەتوونی چەقەڵانی تێدەچەقێ
لەلای ئێمە: بەفر گووی گانی گەمەی گەنی گەوزێندراوی گاڵتانی بەسەردا دەڕژێ
لەلای ئێمە: باخچە بای باری بەهری بۆزی بۆمبارانی تێدەپەستێ

لەوێش (لەوێ، لە دوور): لەم ئێزگەڵا دەردەکا،
وشکایی لەخۆیەوە جوانی دەگرێ؛
خەون لە ماوەی یەک چرکەدا دەبێتە جوانترین هەقیقەت.

# تەوش

من لە هەولێر لەدایکبووم، لە بەغدا لینینم ناسی، لە تاران هەستم بە بێ وڵاتیی خۆم کرد، لە دیمەشق بە کوردبوونم، لە ئۆسپانهۆف چاوم کردەوە، لە ئۆلبۆرگ پەساپۆرتم وەرگرت، لە کۆپنهاگن بیری خۆکوشتن رووی تێکردم، لە ستۆکهۆڵم بۆ یەکەمین جار لەگەڵ ژنێکی ئەورووپی نوستم، لە پاریس یەکەم دیپلۆمی بێگانەم وەرگرت، لە کراکۆف گوێم بە مۆسیقای شۆپان زاخاودرا، لە سانتیاگۆ بە ئەوین، لە دۆسۆڵدۆرف بە کینە...

ئێستا حەزدەکەم، وەک جوولەکە بازرگانە نەمساوییەکانی ساڵانی جەنگی جیهانیی دووەم، بچم ماوەیەکیش لە کەنەدا کاربکەم، پاشان بچم ژنێک لە بەرازیل بێنم، ئینجا بێیمەوە ئەورووپا و کتێبێک لە لەندەن بڵاوبکەمەوە؛ لە کۆتاییشدا بچم لە ئەمستردام خۆم بکوژم: لاشەکەشم، وەک فەردە پەتاتەیەکی بۆگەنکردوو، فڕێبدەنە سەر زبڵخانەیەک و هیچ کەسێک پێیی نەزانێ.

# جەنگ

جەنگ ئێمەی لێرە کۆکردۆتەوە
هەر جەنگیش ئەم جیلە مۆرە دمۆرەی ئێمە لەناو دەبات
هەر خۆیشی سبەینێمان دروست دەکات.

ئێمە بۆ ئەوە نەهاتینە پێشوازیی شیعرەکانی وەلی دێوانە کە ئەمڕۆ ئاوها تەفروتوونا و بەرباد ببین .
ئێمە بۆ ئەوە نەهاتینە بینینی کۆشکە جوانەکانی بێستوون کە ئەمڕۆ واتای
چەماوەیی جوانی ملی قازمان لەپێش چاو بخەن.
ئێمە لەدایک بووین بۆئەوەی ئاسوودەیی پەمبەی حاجی لەقلەق و بەرائەتی سمۆرە بدەینە پشیلە،
کەچی ئەمڕۆ ئەوەتا لەودیو عەقڵەوە
شەڕو بەڕ و مەڕی گەڕ
گەڕیان لە ناسکایی و جریوەی هیواکانمان ئاڵاندووە.
ئێمە لەدایک بووین بۆئەوەی رووناکییەکانی شەرەفی شەڕەفخانی بەتلیسی
بگەیەنینە کۆڵانە تاریکەکانی عەبابەیلێ،
کەچی لەسەر رێگەی سلێمانی تووشی دیواری ئانع هاتین و نەمانتوانی تەنانەت لە چایخانە ئاودەست پیسەکانی
کانی وەتمانیش بیپسی کۆلایەک بخۆینەوە.

جەنگ ئێمەی لێرە کۆکردۆتەوە.

جەنگ هەمووومانی دروستکرد.

ئێمە کوڕی جەنگین.

جەنگ بێژنگی شیعرەکانی ئەم سەردەمەیە.

جەنگ باوکی هەموو ئەم جیلەیە.

**جەنگ دایکی هەمووومانی گا.**